ف: کارخانه‌ی کاشی، کاشی‌سازی.

ع: فاخورَةُ القَیشانی.

**کارخستن**

ك: رێگەخستن. [خستنەگەڕ]

ف: کارانداختن، راەانداختن. راندن.

ع: اِجراء، اِعمال.

**کارد**

ك: وێرد. [تێخی دەسکداری بچووك.]

ف: کارد، گَزلَک، کَزلَک.

ع: مُدیَة، شَفرَة، سِکّین، سیخ.

وێنە

**کاردخنجەر**

ك: دەشنە. [جۆرە کاردێکە.]

ف: دَشنه، بَرازبان، بَرازوان.

ع: شَفرَه، سِکّین، خَنجَر.

وێنە←دەشنە

**کارد و پەنیر**

ك: دژمەن، نەساز. [ناتەبا، نەگونجاو (ئیدیۆمە.)]

ف: دشمن، کارد و پنیر، ناسازگار. (کنایه است.)

ع: ضِدّ، ضِدّان، ضِدّانِ لایَجتَمِعان.

**کاردۆژە**

[ك: کاردەوەژە (کاکڵەی گوێز کە بە کارد دەری‌دەهێنن.)]

ف: کارداَوژه. (مغـز گـردو کـه بـا کـارد بیـرون آورند.)

ع: لُبّ الجَوز.

**کاردەپەلە**

[ك: باڵندەیەکی قاچ کورتە و لە پەرسێلکە دەچێت.]

ف: بالوایه، پالوایه، پالوانه، پیلوایه، رازال، زازال.

ع: اَبابیل، سُنونیَّه، سُنونُوَة.

وێنە

**کاردەپەلە**

ك: گزنیـژە. [(زیریـوونی لـەش لـە سـەرمادا وەکـوو ئـەوەی زیپکەی دەرکردبێت و هەر ئەوەندەی لەش گەرم دەبێتەوە خێرا دەنیشێتەوە.)]

ف: گُزاز. (زبـر شـدن بـدن از سـرما مثـل اینکـه جوش درآورده، همینکـه بـدن گـرم شـود فـوراً خاموش می‌شوند.)

ع: قُشعَریرَة.

**کار زۆرەکی**

ك: بێگاری. [ئیشی زۆرەملێ کردن.]

ف: مَجرَک، مَچرَک، بیگاری.

ع: سُخرَة، کُلفَة.

**کارژێلە**

ك: کار. [کارژەلە (بێچوە بزنی شەش مانگە.)]

ف: هیرَک، بُزغاله، بُزبَچه. (بچه بُز شش‌ماهه)

ع: جَدي، حُلان، عَناق.

**کارسازی**

ك: کار دورس کردن. [پێکهێنان راپەڕاندن ئەنجام دان]

ف: کارسازی. کار درست کردن.

ع: تَأدِیَة. اِسعاف، قَضاء.

**کارسان←کارخانە**

**کارك←قارچك** [(ڕشەیەکی کرماجیە.)] (کرماجی است.)

**کار کردن**

ك: فرمان کردن. [ئیش کردن]

ف: کارکردن.

ع: فَعل، عَمَل.

**کار کردن**

ك: کاری بوون. [بەکاربوون، بەبڕشت بـوون(ی قـسە شمشێر و...)]

ف: کارگرشدن. (سخن، شمشیر مثلاً.)

ع: حَیك، حَیَکان، اِحاکَة، تأثیر، نُفُوذ.

**کارکردن**

ك: ڕێگەکەفتن. [ڕەوان بوون (سکچوون)]

ف: روان‌شدن، کارکردن. (کارکردن شکم)

ع: عَمَل، اِجابَة، اِسهال.

**کارکون← موسهیل**

**کارکەردە**

ك: قـەیرە، لـەکاردەرهاتگ. [کاردیـدە، خـاوەن ئـەزموون: ڕاهاتوو لە کار.]

ف: کـارکرده، کـرده‌کـار، وَسـکرده، وَشـکرده، واشکرده، کارآزموده.

ع: مُجَرَّب، مُدَرَّب، مُمَرَّن. بَصیر، خَبیر.

**کارگا← کارەگا**

**کارگای جۆڵایی**

[ك: مەکینەی چنین.]

ف: هَف.

ع: نَول، حَفَّة، مَنسَج... .

وێنە← دەسگای جۆڵایی

**کارنامە**

[ك: پەڕاوێك کە لیستەی کارە ئەنجامدراوەکانی تێدایە.]

ف: کارنامه.

ع: دَفتَرُ الاعمال.

**کاروا← کارەوا**

**کاروان**

[ك: قافڵە]

ف: کاروان، کاربان.

ع: رَکب، عیر، قافِلَة، سَیّارَة.

**کاروان‌ئاشی**

ك: پیازاو. [گۆشتـاوێکی خەسـتە بـە پیـازەوە. (چێشتێکی بەناوبانگە.)]

ف: اَشکَنه. (آشی است معروف.)

ع: شَوب.

**کاروانسەرا**

ك: تیمچە. [کارمسرا: جێگەی پشوودانی قافڵە.]

ف: تیم، تیمچه، سرا، کاروان‌سرا.

ع: خان، فُندُق.

**کاروانسەرادار**

[ك: بەڕێوەبەری کاروانسەرا.]

ف: سرایدار، تیمدار.

ع: رَئیسُ الخان.

**کاروانکوژ**

ك: کاروان‌کوژە. [(ئەستێرەیەکی پرشەدارە وەك گەلاوێـژ کـە بـە عـەرەبی «شـعرای یـەمانی» پێـدەڵێن و نیوەشـەو لـە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێت.)]

ف: شَـباهَنگ، کـاروان‌کُـش، سـاربان‌کُـش. (ستاره‌ای است روشن شبیه به «گەلاوێژ» یعنـی شعرای یمانی که نصف شب طلوع مـی‌کنـد در سمت شمال شرقی.)

ع: شِعری الکاذِب، شِعری.

**کاروانە**

[ك: کەرەواڵە]

ف: کاروانَک، کاروانه، کاروان، کَروان، کاردانَـک، چوبینه.

ع: کَرَوان.

وێنە

**کاروایی← قوەی کەهرەبائیە**

**کاروبار**

[ك: ئیشوکار.]

ف: بیاوار، کاروبار.

ع: اُمُور.

**کاروبا**

ك: کارەوا، زەردەیـی. [جیـوەی زەردی ڕەقبـووی دارێکـە زۆر بەنرخە.]

ف: کاەرُبا، کَەرُبا.

ع: کَهرباء.

**کارەکەر**

ك: قەرەواش، سەرمەفرۆشی. [کەنیز، جێری، قەرواش]

ف: داە، کَنیز، کَنیزَک، پرستە.

ع: خادمَة، جاريَة، غُلام، اَمَة.

**کارەگا**

ك: کارگا. [کارگەی جۆلایی. ئامرازی جۆلایی.]

ف: هَف، کارگاە، کارگە.

ع: مَنسج، مِنسَج، مِنساج، مَعمَل. نَول، حَفَّة.

وێنە

**کارەوا**

ك: کاروا، زەردەیی. [جیوەی زەردی رەقبووی دارێکە زۆر بەنرخە]

ف: کاەرُبا، کَەرُبا، کارُبا.

ع: کَهرُباء.

**کاری**

ك: کاریگەر، کەسکون. [بەکار. مرێنەر]

ف: کاری، کارگر. مرگ‌آور.

ع: مُؤثِر. مُزعِف، مُهلِك، نافِذ.

**کاری**

ك: لێهاتگ، قۆچاخ. [لێهاتوو، چالاك]

ف: کاری، کارآمد، کارکن، وَسکردە، وَشکردە.

ع: کافي، فَعّال، مقدام، قَدوم.

**کارێز**

ك: ... کوورە، قومْش. [ئاوێك کە لە بن زەویەوە دەرهێنراوە و داپۆشراوە.]

ف: کاریز، کهریز، راەآب، کُمُش، فرکند، فرسَنگ.

ع: قَناة، مِفتَح، کِظامَة.

**کارێزکەن**

ك: قومْشکەن. [ئەو کەسەی کارێز هەڵدەکەنێت.]

ف: کُمُش‌کن، کُمُش زن، کَـنکن، کَـتکن، شـکاونە، شکاوندە.

ع: مُقَنّي، حَفّار.

**کاریگەر**

[ك: کرێکار]

ف: کارگر، کاریگر، مُزدور.

ع: عامِل، ساعي، اَجير. عَمَلَة، فَعَلَة.

**کاریگەر**

ك: کاری، کەسکون. [کارتێکەر، سوودبەخش. تیابەر]

ف: کارگر، کاری، نوژبخش. (اثر بخش)

ع: مُؤثِر، نافِذ. مُزعِف، مُهلِك.

**کاژ**

ك: پۆسمار. [کراژی مار (توێژی مار کە خۆی دەیخات.)]

ف: گنگار. (پوست مار کە خود می‌اندازد.)

ع: خِرشاء، سَبيء، سلخ، قِشار، شَرانِق.

**کاژ**

[ك: داری کاج.]

ف: کاج، کاژ، نَشک، کَرکَر.

ع: شُوح.

وێنە

**کاژێلە**

ك: قاخلێ. [کاخلێ: گیایەکی لاسك سپی گوڵ زەردە.]

ف: کاژیرە، کاجیرە، کافیشە، خَسَک.

ع: اِحريض، عَصفَر، عُصفُر، قُرطُمّ. («قُرطُم» را بـر «حَبُّ الاحريض» نيز اطلاق کنند کـه بـه فارسـی «خَسَک‌دانە» يا «تخم کاجيرە» گويند.)[1]

---

١- [«قرطم» لە عەرەبیدا مانای کاژیرە و هەروەها مانای تۆوی کاژیرەش دەدات.]

**کاس**

ك: گێج، سر. [ور، مەنگ (بێهەستبوونی مێشك.)]

ف: کَرَخ، کَرَخت. (بی‌حس شدن مغز سر)

ع: خادِر، خَدِر، هَوِس.

**کاس**

ك: چاڵ، قولۆر، کولۆر. [قوپاو، ناوچاڵ]

ف: گود.

ع: مُقعَّر.

وێنه← قولۆر

**کاسب**

ك: پیشەوەر. [کەسێك کە کاری کڕین و فرۆشتنە و بە بازرگان دانانرێت.]

ف: پیشەور، اَهنوخوشی، اَلفان، اَلفَنج.

ع: کاسِب، رَقاحِي.

**کاسبی**

ك: خریوفرۆش، پیشەوەری. [کڕین و فرۆشتن]

ف: اَلفیدن، اَلفَختن، اَلفاختن، اَلفغدن، اَلفَنجیدن، پیشەوری، خَرید و فروش.

ع: کَسب، رَقاحَة.

**کاسك**

ك: سەوز. [کەسك: رەنگی گیا. (وشەیەکی کرماجیە.)]

ف: سبز. (کرماجی است.)

ع: اَخضَر.

**کاسنی**

ك: چەقچەقە. [(گیایەکی بەناوبانگە.)]

ف: کَسنی، کاسنی، کَسناج، اَنوپا. (معروف است.)

ع: هِندَب، هِندَبا، هِندَباء، یَعضید.

**کاشی**

ك: کاشی. [قاپ]

ف: کاسه، لاک، پیمانه.

ع: قِحف، جَفنَة، صَحفَة، طاس، کاس، کاس، قَصعَة.

وێنه

**کاسە**

ك: قەرپۆز. [بۆری چرا.]

ف: کاسه، قارپوز.

ع: حَباب، قَربوس.

وێنه← قارپۆز

**کاسەسڕ**

ك: کاسەشۆر. [(پەڕۆیەك کە کاسە و تیانە و ...ی پێ دەشۆن.)]

ف: کاسه‌شور. (کهنه‌ای که با آن کاسه و دیگ و غیره می‌شویند.)

ع: مِرشَفَة، مِغسَلَة.

**کاسەسفرە**

[(ك: میوانداری کەسێك کە لە سەفەر گەڕاوەتەوە.)]

ف: کاسه‌سفره. (اطعام رسیده از سفر)

ع: لُهنَة.

**کاسەشۆر**

[ك: گیایەکی بەناوبانگە، گەڵاکەی پان و ئەستوور و زبرە.]

ف: علفی است معروف، برگ آن پهن و ستبر و زبر است.

ع: ...

**کاسەشۆر← کاسەسڕ**

**کاسەکەل**

ك: کاسە کەلە، کەلەکە. [لەتە گۆزە]

ف: کَلَک، پاره سبو.

ع: اَصیص.

**کاسەگەردانی**

ك: کاسەگەڕانێ، چلانە. [یاریەکی جارانە.]

ف: جُدارَک، جُدانَک، چِلانَک، کوزەگردانی.

ع: لَعبُ الکوز.

**کاسەلێس**

[ك: کەسێك کە قاپ دەلێسێتەوە. هەروەها: مرۆڤی چڵێس یا خۆفرۆش.]

ف: کاسەلیس.

ف: سلّات.

**کاسە ماس**

[ك: قاپی ماست تێکردن.]

ف: گـویس، گویـسە، گـویش، گویـشە، کَـویش، کَویشە.

ع: کاسُ الرُّوبَة.

**کاسەمەن**

ك: پێوانە. [(کاسەی پێوانەی کرین و فرۆشتن.)]

ف: کاسەمن، پیمانە. (کاسەی پیمانە)

ع: مِحفد.

**کاسەی چاو**

[ك: جێگەی چاو لە کاسەسەردا.]

ف: کاسەی چشم.

ع: قلت، جُبَّة، لَحج، کَفَّةُ العَین.

**کاسەی زرانی**

ك: کڵاوەی زرانی. [کاسەئەژنۆ]

ف: گردنا، کاسەی زانو.

ع: رَضفَة، داغِصَة.

**کاسەی سم**

[ك: کاسە سم: پشتی سمی چوارپێ.]

ف: کاسەی سم.

ع: حافِر، صَحن.

**کاسەی سەر**

ك: کاسەی مەژگ. [قاپێلکە سەر]

ف: گدفت، آهیانە، کاسەسر.

ع: قِحف، شَواة، جُمجُمَه.

**کاسەی شکوفە**

ك: قۆزاخە. [بەرگەگوڵ]

ف: گوزە، کاسەی شکوفە.

ع: کِـمّ، کِمامَـة، قلـف، قَنـب، قُنبُـع، غِـلاف، کَـاس، خَریطَة، کاسُ الزَهرَة.

وێنە

**کاسەی فەقیان**

ك: کاسەی فـەقیران، کاسـەی هـەتیمان، سـفرەی فـەقیـان.

[هەشت ئەستێرەیە لە ئاسماندا.]

ف: کاسەی یتیمان، کاسەی درویشان.

ع: اِکلیل شمالي.

**کاسەی فەقیران← سفرەی فەقیران**

**کاسەی کوو**

[ك: قەعدە: کاسەی پیسایی تێکردنی منداڵ.]

ف: ریخدان،کاسەی گُه.

ع: مِقعَدَة.

**کاسەی گوێچکە**

[ك: بەشی بەرچاوی گوێ.]

ف: کاسەی گوش.

ع: صَدَفَة، صَحنُ الاُذُن، مَحارَةُ الاُذُن.

**کاسەی هەتیمان← سفرەی فەقیران**

**کاسی**

ك: گێجی، کاسبوون. [وڕبوون]

ف: کَرَخی، کَرَختی.

ع: خَدَر، هَوَس.

**کاش← کاشکای**

**کاشتن**

ك: کێلان، کێلاَنن. [چاندن]

ف: کاشتن، کشتن.

ع: زَرع.

**کاشته**

ك: وەرز، کشت. [چێنراو.]

ف: کشت، وَرز.

ع: زَرع.

**کاشکای**

ك: خوەزگای، خوەزگه، کاش. [خۆزگه بریا]

ف: کاش، کـاج، کاشـک، کاشـکی، کاشـکه، اَندی، اَندیکه.

ع: لَیتَ، عَسَی، لَو. (لو ذاتُ سِوارٍ لَطَمَتني.)

**کاشمه**

[(ك: گیایەکی بناریانگه.)]

ف: کاشمه، کاشم. (نباتی است معروف.)

ع: کاشِم.

**کاشی**

ك: کاسه. [قاپی رەنگ‌لێدراو.]

ف: کاسه، کاشی، کاچی.

ع: کأس، طاس، قَیشاني.

وێنه

**کاشیساز**

ك: کاشـیپەز. [کەسـێك کـه دەفـری رەنـگ‌لێـدراو دروسـت دەکات.]

ف: کاسه‌گر، کاشی‌ساز.

ع: فَخّاري، فَخوري.

**کاغەز**

ك: قاغـەز، کاگـەز، قاگـەز، قاقـەز. [کـاغز (کاغـەزی نەنووسراو.)]

ف: رُخته. (کاغذ ننوشته)

ع: رَقّ، طِرس، رِجل، نَمَق، قِرطاس، کاغَد، کاغَذ.

**کاغەز**

ك: قاگەز، نامه، نویشته، دەسنویس. [نووسراو، دەسنووس]

ف: بتک، کاغذ، نامه، نوشته.

ع: مَکتوب، رُقعَة، رَقیمَه، ذَریعَة، صَحیفَة، رَسیلة، ذِبر، زَبور، زَبیر، کِتاب.

**کاغەز بێکاره**

[ك: کاغەزی بێکەڵك.]

ف: چَکـسه، داروپـیچ، کاغـذ شکـسته، کاغـذ بیکاره.

ع: باطِلَة. (اَوراق باطِلَة)

**کاغەز رۆشن**

ك: کاغەز شیشەیی. [جۆره کاغەزێکی تەنك و چەوره.]

ف: چَربَک، چَربه.

ع: شَفیفَة، شَفّافَة.

**کاغەزساو**

[ك: کەسێك که سماته له کاغەز دەدات.]

ف: رُخنەسای، کاغذسای، ساینده.

ع: صَحّاف.

**کاغەز شیشەیی←کاغەز رۆشن**

**کافر**

ك: تەرەس، بێ‌ئایین، گومرا. [بێدین، بێ‌بڕوا]

ف: مَنبَـل، بَـشم، بـی‌کـیش، بـی‌آیـین، دژکـیش، بدآیین.

ع: کافِر، مُلحِد، لامَذهَب.

**کافرمان**

ك: تیَغ، سەرتاش. [چەقۆی تیژی موتاشین.]

ف: اُستُره، پاکی، تیغ.

ع: موسی، مِحلاق.

وێنه

**کافرۆش**

[ك: کەسێك که پیشەی فرۆشتنی کایه.]

ف: کاه‌فروش.

ع: تَبّان، عَلّاف.

**کافوور**

[(ك: شیرەیەکە لە درەختی کافوور دەگیدرێت.)]

ف: کافور. (صمغی است از درخت کافور می‌گیرند.)

ع: کافُور.

**کافی**

ك: بەس، کەفاف. [بە ئەندازەی پێویست.]

ف: بَس، بَسَند، بَسَندە، کَفاف.

ع: حَسب، کافِي.

**کافی**

ك: زرەنگ، قۆچاخ، کاری. [لێهاتوو، کارا]

ف: زرَنگ، برازندە، کاری، شایستە، وَشکَردە.

ع: کافِي، فَعّال، مِقدام.

**کاک**

ك: پیاگ، برا، کاکە. [پیاو، براگەورە.]

ف: کاک، مرد، برادر، دادَر.

ع: رَجُل، مَرء، اَخ.

**کاک**

ك: نانچایی. [جۆرە نانێکی شیرینە.]

ف: کاک، سوخاری، نان‌چایی.

ع: کَعك.

**کاکاوو**

[ك: کاکانو: دەنکی بەری دارێکە دەیهارن و وەك قاوە دەیخۆنەوە.]

ف: کاکائو، بادام‌هندی.

ع: کاکاهو، لوز هِندي.

**کاکشیر**

ك: قەلبیە، قر، خنجکە. [هەڵسوکەوت بە ناز و لەنجەولارەوە.]

ف: قر، کاچول. (رفتار با ناز و تَبَختُر)

ع: عَرقَلي، تَخَطُّل، تَبَختُر، حَیَکان، مَیَحان.

**کاکڵە**

ك: ناوکە گوێز. [کاکڵ]

ف: مغز گردو.

ع: لُباب الجوز، لُبّ الجَوز.

**کاکڵەشێران**

[(ك: یاریەکی بەناوبانگی منداڵانە کە یاریکەران دەبنە دوو دەستە. دەستەیەك خۆیان دەشارنەوە و ئەگەر دەستەکەی تر بیاندۆزنەوە دەبێت بە کۆڵ بیانگوێزنەوە.)]

ف: بازی معروف بچه‌ها که دو دسته می‌شوند، یک دسته پنهان می‌گردند و دسته‌ی دیگر آن‌ها را پیدا می‌کنند و سوار می‌شوند.

ع: لَعبُ الاختِفاء.

**کاکڵە مووشان**

ك: جوڵاییکەرە، پەسپەسەکوڵە. [جاڵجاڵۆکە]

ف: زِجال، دیوپا، جولاهک، جولاهە، تَندو، تَنَندو، کَرەتَن، کَروتَنە، کارتنە، تارتَنە، تارتَنَک. کلاش، عنکبود.

ع: مُول، زُوع، هَبور، کَحول، مِنَنَة، مَنونَة، عُکاش، عُکّاش. فُدس، عُندُب، عَنکَبوت.

**کاکڵە مووشان**

ك: کەرو، کەرتێنە. [(داوی جاڵجاڵۆکە.)]

ف: کَرە، کَری، کَرو، تَفَند، تَفنی، تَنتَە، تَنَستە، اَنفَست، اَبَرکاکیا، کلاشخانە. (تار عنکبود)

ع: شُعَ، حُقّ، هَلَل، عُکاشَە، نَسجُ العَکنَبوت، بَیتُ العَنکَبود.

وێنە← جۆڵاییکەرە

**کاکڵە مووشان**

[(ك: یاریەکی منداڵانە کە کۆمایەك خاك هەڵدەدەنەوە و ناو

دەکەن بە سەریدا هەتا بە قەد یەك پەنجەی لـە سـەرەوە دەبێتـە قوڕ، پاشـان لـە سـێ چـوار لاوە خۆڵەکـەی ژێـری بـە ڕێکـی دەردەدەن و گومەزێك دەمێنێتەوە.]

ف: کوهاموی. (بازیچەی بچەها است، مقداری خاک تپه می‌کنند و آب روی آن می‌پاشند تا به اندازەی یک انگشت روی آن گل شود، سـپس از سه یا چهار طرف آن را منظماً شـکافته، خـاک توی آن را بیرون می‌آورند یک گنبد می‌ماند.)

ع: بَقّیری.

وێنە

**کاکنج**

ك: وەریپشتپەردە. [گیایەکە.]

ف: کَجومَن، کاکنج، عروس‌پشت‌پرده.

ع: قَطیفَة، سالِفُ العَروس، کاکَنج.

**کاکوڵ**

[(ك: مـووی تەوقەسـەری مرۆڤ یـا گیانـدار یـا پـەڕی بەرزەوەبووی تەوقەسەری باڵندە.)]

ف: کاکُل، کاکول، کَویـل، کَویلـه، کوبَلـه، کوپَلـه، بُش، پَش، توک. (موی فرق سر انسان یا حیوان یا پر زیادی بالای سر پرنده)

ع: فَشٌّ، ذُؤابَة. عُرف. عُفرَة، قُزَّعَة، قَزیعَة، قُنزُعَة، طُهافَة.

وێنە← جووە

**کاکوڵ مەل**

ك: کلاَوتە. پۆپە. [کلاَوە. پۆپنە]

ف: پوپ. کاکُل.

ع: قُنبُرَة. مِغفَر.

وێنە← جووە

**کاکە**

ك: ئابرا، داشێ. [(براگەورە.)]

ف: کاکا، برادر، داداش. (برادر بزرگ)

ع: اَخ.

**کاکەشان**

ك: کەشکەشان. [کادز، کاکشان]

ف: کهکشان، کاهنگان، پالاهنگ، آسمان‌دره.

ع: مَجَرَّة.

**کاکیلە**

ك: چناکە. [شەویلە: ئەملاولای چەناکە.]

ف: چانه، زَفَر، آرواره.

ع: حَنَك، طَلع، لَهزَه، لِهزِمَة، نُکفة. (لَهزَتان، لِهزِمَتان، نُکفتان.)

وێنە← کاسەی سەر

**کاکڵ**

ك: سواخ. [قوڕ و کا.]

ف: اَرزه، آرزه، خازه، اَندا، اَندود، اَنداوه، کـاه‌گـل. اَندایش.

ع: سَجّ، شِید، سِیاع، خَلِیط.

**کاگەز**← **کاغەز**

**کالسکە**

ك: گالیـــسکە. [عەرەبانـــەی گواســـتنەوە کـــە ئەســـپ رایدەکێشێت.]

ف: کالسکه، تخت روان.

ع: عَرَبَة

وێنە← گالیسکە

**کالیار**

ك: ترۆزی تۆم. [(ترۆزی زل کە بۆ تۆم هەڵگیراوە.)]

ف: غاش، غاوشو، غاوش، خاوش. (خیار چنبـر تخم)

ع: شَعرورُ الحِمار.

وێنە← ترۆزی

**کالیار**

ك: خەیار تۆم. [(خەیاری زل کە بۆ تۆم هەلگیراوە.)]
ف: پاشـنا، پاشَـنگ، پاشَـنگە، باشَـنگ، شَـنگ، باوش. (خیار تخم)
ع: قِثّاءُ الحِمار.
وێنە← خەیار
**کالیۆش← کایلۆش**
**کاڵ**
ك: نەکوڵیاگ، کرچ. [نەکولاو، پێنەگەییو.]
ف: کال، خام، ناپُختە، نارَس.
ع: نِيّ، نيء، مُلَهوَج...
**کاڵ**
ك: نەگەیگ، کنج. [نەگەییو، نەبەکام (میوە)]
ف: کال، نارَس، نرسیدە. (فواکە)
ع: فجّ.
**کاڵ**
ك: کەمرەنگ. [بەرامبەری تۆخ.]
ف: کمرنگ. (ضد سیر)
ع: ناصِل.
**کاڵ**
ك: کشت. (کشتوکاڵ) [کار: پاشگرە (چاندراو، بە تەنیا بەکار ناهێنرێت.)]
ف: کـشت، کـار. (کـشتوکـار، تنهـا اسـتعمال نمی‌شود.)
ع: زَرع.
**کاڵ**
[ك: کێلْ بکێلْ (داڕشتەی بکەرە.)] (تەرەکاڵ)
ف: کار. (صیغەی فاعل است: ترەکار)
ع: زارع. (زارعُ البَقل)
**کاڵا**
ك: کورتـــاڵ. [قومـــاش، پێداویـــستی، ئـــەوەی بـــە پـــارە دەکردرێت.]
ف: اَروس، کالا، خواستە.
ع: عَرَض، مَتاع.
**کاڵات**
ك: تالان، کالەت. گونا. [راورووت. تاوان]
ف: چَپَو، چَپاول، تاراج، یَغما. گُناه، بَزِهْ.
ع: نَهب، غارَة. جِنایَة.
**کالمەکاڵ**
[ك: ← کالومەکاڵ]
ف: کشت نە کشت.
ع: دائِر وَ بائِر.
**کالومەکاڵ**
ك: [ك: کالمەکاڵ (چێنراو و بەیار)]
ف: کشت‌وزار، کشت‌وزمین. (مزروع و نامزروع)
ع: زَرع وَ سُبات، دائِر وَ بائر.
**کالە**
[ك: پێلاوی لە چەرمی خاو دروستکراو. (تورك «چاروغ» و «چارووق» و «چاروغ»ی پی‌دەلێن.)]
ف: کـالی، لَکـا، شُـم، شَـمَل. (ترکـی «چـاروغ»، «چاروق»، «چارغ» گویند.)
ع: غَرِیفَة.
**کالەبرویش**
[ك: برێشی کاڵ. (گەنمی نەکولاوی وردکراو.)]
ف: بلغور خام. (گندم نپختە را خورد کنند.)
ع: رَضیض، حَشیس. جَریش.
**کالەبرویش**
ك: گژنیژە. [(تەرزەی ورد و وشك.)]
ف: تَگَرگچە. (تگرگ ریز و خام)
ع: اِرزیز، قَطقَط.
**کالەت← کالات**

**کاڵەک**

[ک: گندۆرە: میوەیەکە.]

ف: فَریوَک، خَربُزە، اَربوزنیا، اَربوجینا.

ع: بِطّیخ، عَجور.

**کاڵەکەمارانە**

[ک: بەری گیایەکە لە شەمامە دەچێت و زۆر تاڵە.]

ف: پَهی، پَهنور، کَبَست، کَبَستو، کَبَستە، شَرَنگ، سیماهَنگ، تَلخَک، زراوَند، زهرگیـاه، خَربُـزەی روباه.

ع: صاب، عَلقَم، شَرَی، هَبد، هَبید، حَدَج، حَنظَل، قِثّاء البَر، قِثّاءُ الحِمار.

وێنە

**کاڵەمشتێ**

ک: پشکیلان. [کاکڵەمشتێ: یاریەکە. (شتێك بە دزیەوە دەخەنە نار مشتیان و هەر دوو دەستیان دەهێننە بەرەوە هەتا لایەنی بەرامبەر بڵێت لە کام مشتدایە.)]

ف: کَچەبازی، مشتبازی. (چیزی از پشت توی مُـشت مـیگذارنـد و هـر دو مُـشت را جلـو میاندازند تا حریف بگوید در کدام مُشت است.)

ع: فِئال.

**کاڵەوبوون**

ک: رەنگرِوین. پاکەوبوون. [کاڵ بوونەوە، کەمرەنگ بوون]

ف: رنگرفتن. پاکشدن.

ع: نُصُول، نُضُوّ.

**کاڵەهێش**

ک: یەلهێشە. [زەویەك کە یەك جار کێڵراوە.]

ف: یک شُخمە. (زمینـی کـه یـک مرتبـه شُـخم شده باشد.)

ع: مُنفَلِج.

**کاڵی**

ک: نـەکوڵیاگی. نەگـەیگی. کـەمرەنگی. [نـەکوڵاری. پێنەگەییوی. ناچخ.]

ف: خامی، نپُختگی. نارَسی. کمرنگی.

ع: نُیُوء. فَجاجَة. نُصُول.

**کاڵێ**

ک: چەرمەڵاتە. [سپیکەلە («ی» لـە «کـاڵێ»دا نیـشانەی بچووکیە.)]

ف: سفیدپوست، کمرنگ. (یا [در «کالێ»] بـرای تـصغیر است.)

ع: مُلَهَّق، نُوَیصِل.

**کاڵیان**

ک: خورِین، داخورِین. [گوڕشەکردن.]

ف: سـته، سـتهیدن، توپیـدن، غُریـدن، نَهیـب، ستیز، ستیزە، اشتلم.

ع: تَشَدُّد، تَذَمُّر، اِبراق.

**کاڵیت**

ک: کوڵیت. [بۆسە (حەشارگە)]

ع: هـودل، کمینگاه. (رصدخانە)

ع: رَصَد، مَرصَد.

**کاڵیتگا**

ک: کۆڵیت. [بۆسە (حەشارگە)]

ف: هـودلگاه، هـودلخانە.

ع: مَرصَد، رَصَد.

**کاڵین**

ک: کێلان، کێلانن. [چاندن، شۆرپرینی زەوی]

ف: کاشتن، کشتن.

ع: زَرع، فَلح.

**کام**

ک: نارەزوو. [ئاوات، مەبەست]

ف: کام، آرزو.

ع: أمَل، مأمول، مَقصود، مَرام، مُراد.

**کام**

[(ك: نەخۆشینێکە بە هۆی بەسەرچوونی ژەمی جۆخواردنەوە دەمی ئەسپ بلۆق دەکات و ناتوانێت جۆ بخوات.)]

ف: کام. (مرضی است به سبب تأخیر جو دهن اسپ تاول می‌زند و نمی‌تواند جو بخورد.)

ع: لُکاث

**کام؟**

ك: کامە؟، کامیان؟ [کێهە؟]

ف: کدام؟، کدامین؟، کدام‌یک؟

ع: أيّ؟

**کامڵ**

ك: تەواو. ڕەسا. [بێ کەموکووڕی]

ع: تمام. رَسا، رسیده.

ع: کامِل، تامّ.

**کامە←کام؟**

**کان**

ك: مەڵوەن. [کارالە کارە: جێگەی کانزا لە زەویدا.]

ف: کان.

ع: مَعدِن، مَنجِم.

**کان**

ك: ... بوتە. (کان باغ) [پنج، بنەگیا]

ف: کان. بُتّه.

ع: حُفرَة، فُقرَة، فقیر. اَصلَة. (بیش)

**کان**

ك: مەغز، نەخ. [نارمرۆکە کرۆکە ناخ]

ف: نَخ.

ع: کُنه.

**کاناڵ**

ك: دڕناڵ، دڕگە، کەناڵ. [تەنگە]

ف: نال، ناله، کانال، تنگه.

ع: تُرعَه، قَنال، کانال.

وێنە←دڕناڵ

**کانەزوانە**

[(ك: چاڵایی جێگەی شووشە لە پەنجەرەدا.)]

ف: کانه‌زوانه، کانه‌زبانه، کانه‌وزبانه. (گودی جای شیشه‌ی پنجره)

ع: حُفرَة.

**کانەشکاو**

[ك: (ئامرازێکی دارتاشیە چاڵایی جێگەی شیشەی پەنجەرەی پێ هەڵدەکۆڵن)]

ف: کانه‌شکاو، کانه‌شکاف، کانه‌کَن. (افزار نجاری است که کانه را می‌کَنَد.)

ع: مِنقار.

**کانە نیا**

[ك: شەتڵ چەقاندن]

ف: نشاندن، نشازدن، نشاکردن.

ع: تَفقیر، غَرس.

**کانی**

ك: کانیاو، چاوکە. [سەرچاوە]

ف: چشمه، چَمشه.

ع: مَعین، یَنبوع.

**کانی**

[ك: کانزا]

ف: کانی.

ع: مَعدِني، فِلِزّ.

**کانیاو←کانی**

**کانی‌وکانیاو**

ك: چاوکەسار. [جێگەی پڕ لە کانی.]

ف: چشمه‌سار.

ع: مَجمَعُ العیون.

**کلو**

ك: کەوەرگ. [زاخ، کوول، ئاغەڵی ناو کێو.]

ف: کاووک، کاواک.

ع: قَلَع، لُحَج، وَجر، وَلَجَة.

**کلو**

ك: کێف. [کێو]

ف: کوه.

ف: جَبل... .

**کاولی**

ك: بێشەرم، بێ‌ئابروو، داشۆرياگ. سەلیتە. [ئارسوو، رووهەڵماڵراو. هەروەها: ئافرەتی دەمشڕ و بێحەیا.]

ف: بی‌شرم، بی‌آبرو، کُلوک، خُلولیا... .

ع: بَذي، شَرِس، شَکِس، ذَرِب، وَقِح. فاحِشَة، سَلِیطَه... .

**کاولی**

ك: قەرەچی، بێژنگ‌فرۆش. [خێڵێکی کۆچەری گەڕیدەن.]

ف: کاولی، کابُلی، غَربیل‌باف.

ع: کابَلي، کِربالي.

**کاوەکاو**

ك: سوڵەسوڵ، قرچەقرچ، کاویان. [کزانەوە، چوورزانەوە]

ف: سوزسوز، سوختن.

ع: اِقتِراص، اِحتِراق.

**کاویان**

ك: تووزیان، قرچیان، کاویانەوە. [تۆزانەوە (وەك: تۆزانەوەی دەم بە هۆی بیبەرخواردنەوە.)]

ف: سوختن. (سوختن دهن از خوردن فلفل مثلاً.)

ع: اِقتِراص، اِحتِراق.

**کاویانەوە ← کاویان**

**کاوێژ**

[ك: کاریچ، قاریچ]

ف: کاغ، شُگال، نشخوار، نشخار.

ع: دَسع، جَرَّة، نشوار.

**کاوێژکردن**

[ك: جاوینەوەی پەڵخوڕ.]

ف: کاغش، شُگالش، شُگال کردن، نشخوارکردن.

ع: اِجتِرار، اِدِّساع.

**کاوێژکردن**

ك: ورلێدان. [ژاوەژاو]

ف: ژاژخایی.

ع: دَردَرَة، ضَغضَغَة.

**کاوین ← مارەیی**

**کاهو**

[ك: سەوزەیەکە.]

ف: کوک، کَیوه، کَیو، کاهو.

ع: خَس.

**کاهیل**

ك: سست، هیچنەکەر. [تەوەزەل، بێکارە، لێنەهاتوو]

ف: اَژهان، اَژکان، پَرویش، فَرویش، اَژهَن.

ع: مُدنع، دَنیع، مُهمَل.

**کاهیل**

ك: پێگەیگ. [پێگەیشتوو، کامڵ (کەسێك کە تەمەنی گەیشتووەتە سی تا پەنجا ساڵ.)]

ف: کیاره، رسیده. (کسی‌که سن او به سی تا پنجاه رسیده باشد.)

ع: کَهل، کاهِل.

**کاهیلی**

ك: سستی، کارنەکردن. [تەوەزەلی]

ف: اَژهَنی، اَژکانی، پَرویشی.

ع: اِدناع، دُنوع، دَناعَة، اِهمال.

**کاهێلی**

ك: پێگەیگی. [پێگەییوی، کاملی (گشتنە تەمەنی سی تا پەنجا.)]

ف: کیار. (رسیدن بە سن بین سی و پنجاه)

ع: کُهولَة.

**کاهین**

ك: راززان، پۆشەوێژ، پەریدار. [غەیبزان، نهێنزان، فالچی]

ف: پریدار، پری‌گرفتە، اَختَرگو، فال‌گیر، غیب‌گو.

ع: کاهِن.

**کایلۆش**

ك: کالیۆش. [کایەلووش (کشمیش و کاکڵەگوێز و رۆن دەکەنە ناو دۆکەشک و دوای دوو سێ کوڵ لە سەر ئاگر دایدەگرن. پاشان نانی وشکی تێ ترید دەکەن و دەیخۆن.)]

ف: کالیوس، کالیوش، کالجوش، کلەجوش. (کشمش و مغز گردو و روغن را توی دوغ کشک ریختە، بالای آتش دو سە جوش می‌زند، پایین می‌آورند، سپس نان خشکە ترید می‌کنند و می‌خورند.)

ع: حَیس، عَبیثَة.

**کاینات**

ك: هەسگەل، هەسسی گەل، پەیداگەل، دیارگەل، دیاران، چتگەل. [بوونەوەر]

ف: نیوَر، نیوران، هَستگان.

ع: کائِنات، مَوجودات.

**کاینات جەوو**

ك: چتگەل ئاسمان. [ئەو بوونەوەرانەی لە نێوان ئاسمان و زەویدا بەدی دێن.]

ف: نیوارنیوَر، نیوَرنیوار.

ع: کائِنات الجَوّ.

**کایە**

ك: گەمە، تەتلەمیران. [گاڵتەوگەپ]

ف: بازی.

ع: لَعب، مُلاعَبَة، مُداعَبَة، تَترَّة. لَهو. مُزاح.

**کایەکلێ**

ك: کایە. [لەیستۆك]

ف: بازیچە.

ع: اُلعوبَة، مَلعَبَة، لُعَیبَة، لُعبَة.

**کایگە**

ك: جیگەی کایە. [یاریگا]

ف: بازیگاه.

ع: مَلعَب، مَلهَی.

**کپ**

ك: گیریاگ. [گیراو، تەواو بەستراو (درز و کەلەبەر تێدا نەمار.)]

ف: کپ، کیپ.[1] (گرفتە شدن منفذ)

ع: مُنسَدّ، مَسدود.

**کپەوبوون**

ك: گیریان. [کپ بوون، گیران]

ف: کپ شدن، گرفتەشدن.

ع: اِنسِداد.

**کتابچە**

ك: کتێوچە، دەفتەر. [پەڕاو]

ف: اَوارە، دفتر، کتابچە.

ع: دَفتَر.

**کتاو←کتێو**

---

١- نووسەری بەڕێز بەسەر هەردوو پیتی «ك»ەوە لەم دوو وشەدا سێ نوختەی داناوە. (ر ـ ر)

**کتری**

[ك: دەفری تایبەتی ئاو تێداکولاندن. (قۆری کانزا)]

ف: کتری، آب‌داغ‌کن. (قوری فلزی)

ع: محَمّ، غَلّایَة.

**کتك**

ك: کتە ، پشیّ، نازیّ. [پشیلە]

ف: گربه، پشی، پُشَک، میلی، نازی.

ع: قِطّ، هِرّ، (هِرَّة)، بِسّ، (بِسَّة)، هَرس، سِنَّور، سِنّار، کُلبَة. خَنطَل.

**کتکەکێفیلە**

ك: هەورشەك. [پشیلەی کێوی.]

ف: دَلە، بَبَر، گربه دشتی، گربه کوهی.

ع: وَشق، عَناق، ظَهون.

وێنە

**کتکەنەفتینە**

ك: کوڵەرەیوا. [مایەفیتنە ئاژاوەچی]

ف: گربه‌ی نفتی.

ع: قِتّیتی، اُمُّ الفَساد.

**کتە**

ك: کتك. [پشیلە]

ف: گربه.

ع: هِرّ، قِطّ، بِسّ، هَرس، سِنَّور، سُنّار. هِرَّة، قِطّة، بِسَّة، هَرسَة.

**کتە**

[(ك: وشەیەکە لە وەڵامی قۆزدا دەوترێتە وەکوو «یرحمك الله» لە وەڵامی پژمیندا.)]

ف: جواب سرفه است، مانند «یرحمك الله» در جواب عطسه.

**کتێو**

ك: قتاو، کتاو، دەوتەر. [کتێب]

ف: کتاب، آیار، آیاره، آوار، آواره، دفتر، نامه. نوشته.

ع: کِتاب، سِفر، زَبور، زِبر، عُصفُور.

**کتێو تاریخ**

ك: باسنامە. [کتێبی مێژوو.]

ف: باستان، باستان‌نامه، درج دهقان.

ع: کِتابُ التّاریخ.

**کتێوخانە**

ك: قتارخانە. [کتێبخانە]

ف: ایارخانه، اوارخانه، نامه‌گاه، کتابخانه.

ع: مَکتَبَة، بَیتُ الزُّبُر، خَزانَةُ الکُتُب.

**کتێودانەیەك**

ك: یەلیدان، دانەیەك. [بستنی کتێب. (ئەملاولای کتێب خستنە سەریەك.)]

ف: هم‌گذاشتن. (دَم‌کتاب هم گذاشتن)

ع: صَكّ.

**کتێویەك‌دان ← کتێودانەیەك**

**کچ**

ك: کەنیشك، کناچە. [دۆتە کیژ]

ف: دُختَر.

ع: بِنت، ابنَة، صَبِیّة.

**کچکە**

ك: گچکە ، بووچکلانە. [بچووك]

ف: کیچ، کوچَک.

ع: صَغیر.

**کڕ**

ك: کڕکەفتن. [کڕ کەوتن (لەسەر هێلکە خەوتنی مریشك بۆ جوجکە هەڵهێنان.)]

ف: کُر. (نشستن مرغ بر تخم که جوجه برآرد.)

ع: رَخم، رَخَم، حُبُوم، وَکن، حُضنَة، حِضانَة.

جفجَفَة. (واکِن. واکِنَة)

**کراژ← کراش**

**کراس**

[ك: جلوبەرگی کورتی پیاوانە. هەروەها: جلوبەرگی درێژی ئافرەتان.]

ف: پیرهَند، پیراهَن، پیراهَند، پیراهان، شَوی، گلاله، کُرته.

ع: قَمیص، شَعار، سِربال.

**کراس زرێ**

[ك: سەرکەوای لە زرێ دروستکراو.]

ف: جَوشَن.

ع: یَلَبَة، جَوشَن.

وێنە← جەوشەن

**کراس فانوس**

ك: بەرگ فانۆس، بەرگە چرا. [پارچەیەکی مۆم تێساوراوە کە بە دەوری فانۆسدا دەکێشرا هەتا با نەیکوژێنێتەوە.]

ف: لَکَن، پیراهن فانوس.

ع: لَقَن.

وێنە

**کراش**

ك: کراژ، کرێش. [مۆم مێو (مۆمی هەنگوین.)]

ف:موم، موم انگبین.

ع: عِکبَر، خِرشاء، نَخاریب، شَمعُ العَسَل.

**کراك**

ك: کراکە، کرکراکە. [(کونەگوێ)]

ف: سوراخ گوش.

ع: صِماخ.

**کراکە← کراك**

**کرانن**

ك: پاکەوکردن. پروانن. [هەلکەندن بە شتی تیژ یا لەیەك خشاندن (وەك: کراندنی خەت یا پرواندنی جلوبەرگ.)]

ف: ستُردن، اُستوردن، اُستُردن، تراشیدن، خراشیدن. پاک‌کردن. (خط یا لباس)

ع: حَكّ. حَتّ، فَرك، نَفض.

**کرانەوە**

[ك: کراندنەوە (گۆشت چرین بە گاز.)]

ف: لیسیدن، به دندان کشیدن. (با گاز گوشت را کندن)

ع: عَرق، تَعَرُّق، تَرَمُّم، عَرم، نَحض، لَفو، جَلف، لَفا، نَهس، اِنتِهاس، اِنتِشال.

**کراویە**

ك: زینان، زیرەی رۆمی، زیرەی سەوز. [جۆرە زیرەیەکە.]

ف: زینان، زیره رومی، زینیان، زیره‌ی سبز.

ع: کَرَویا، کَمُّون رُومِي.

**کراهە**

ك: کرێ، مزە، مز. [حەقی کار. کرا، ئیجارە]

ف: مُزد.

ع: کِرایَە، کِراء، کِروَە، اُجرَة.

**کراهەپا**

ك: رێگە، پالادرانە. [کرێی ماندووبوونی پێ.]

ف: پای‌مُزد.

ع: جَعل، اُجرَة، حَقُّ الرَّحمَة، اُجرَةُ الرَّسول.

**کراهەدیان**

ك: کرێدیان. [پاداشی خواردن. پارەیەك کە پاش میوانداری بە میوانی فەقێی دەبەخشن.]

ف: دندان‌مُزد، مزد دندان.

ع: اُجرَة السِنّ.

**کرج**

ك: سیس، ژاکیاگ، چرچ. [ژاکاو]

ف: بَخس، بَخسیده، پژمرده.

ع: مُنکَرِش، مُنقَبِض.

**کرچ**

ك: کـــاڵ، نـــەکوڵیاگ، نیمپـــەز. [نـــەکوڵاو، زەردکـــراو، نیوەکوڵاو]

ف: خام، ناپُخته، نیم‌پُخت.

ع: نِيّ، نيء، نَهيء.

**کرچ بوون**

ك: نیمپەزبوون. [نیوەکوڵ بوون (وەك: گۆشتی زەردکراو.)]

ف: نیم‌پخت‌شدن. (گوشت مثلاً.)

ع: اِنْتِناض.

**کرچە**

ك: چـــرکە. [دەنگێکـــە. (وەك: دەنگـــی ســـەرمیچ کاتێـــك گەرمای دەگاتێ.)]

ف: شَرفه، کرچ کرچ. (صدای سقف خانه مثلاً.)

ع: نَقیض.

**کرچیان**

ك: چرچیان، ژاکیان، سیس‌بوون. [چرچ‌بوون، ژاکان]

ف: بَخسیدن، پَژمرده‌شدن.

ع: اِنکِراش، اِنقِباض.

**کرخەو**

[ك: خەوی قورس.]

ف: خواب گران، خواب سنگین.

ع: نَوم.

**کردار**

ك: کردەوە. [ئاکار (ئارە.)]

ف: کُنش، کُنشت، کردار. (اسم است.)

ع: فِعل، عَمَل.

**کردم**

[ك: وام دانا، گریم]

ف: گیرَم.

ع: هَبْ، فَرضاً، فَرَضنا.

**کردم**

[ك: پێکم هێنا.]

ف: کَردَم.

ع: فَعلَتُ، عَمِلتُ.

**کردن**

[ك: پێك‌هێنان (چارگە.)]

ف: کـنش، کـردن، نمـودن، پـرداختن. (مـصدر است.)

ع: فِعل، عَمَل، جَعل، اِقدام، اِرتِکاب.

**کردن**

ك: گان کردن. [جووت‌بوون.]

ف: کردن، زدن، کُس کردن.

ع: فِعل، جِماع، وِقاع، وَطأ، نَیك.

**کردن**

[ك: تێکـردن. تێرِشـتن] (ئـاوی کـردە گـۆزە، رۆنـی کـردە خیگە.)

ف: کردن، ریختن.

ع: کَثب، حَقن، اِدخال.

**کردن**

ك: چوون. (لە چە ئەکا؟) [رێچوون هاوشێوەیی]

ف: ماندن. (بە چە می‌ماند؟)

ع: شَباهَة.

**کردن**

[ك: بەجێ‌هێنان]

ف: کردن، توختن، گذاردن، پرداختن.

ع: تَأدیَة.

**کردنەوە**

ك: شکاتن. [شکاندن. لەت‌کردن (وەك: دارکردنەوە.)]

ف: شکستن. (هیزم مثلاً.)

ع: شَقّ، جَزل، قَصف، غَصف.

**کردنەوە**

ك: وازبوون، شکۆفیانەوە. [پشکووتن]

ف: شکفتن، کشفتن، کشودن، گشودن، واشـدن، وازشدن، باز شدن.

ع: بَلق، تفتُّح، تَشَقُّق. فتح، تَقنيب.

**کردنەوە**

ك: وازکردن. [رایی کردن (وەك: کردنەوەی گرێ یا قفل.)]

ف: گشودن، بازکردن. (گره یا قفل مثلاً.)

ع: حَلّ، فَكّ، فَسخ. زَبق، فَجو، سَني، سَنو.

**کردنەوە**

ك: شکانن. [هەڵوەشاندن (وەك: رۆژووکردنەوە.)]

ف: بازکردن، واکردن، شکستن. (روزه مثلاً.)

ع: فُطور.

**کردنەوە**

ك: شیەرکردن. [شی‌کردنەوە]

ف: زدن، واخیدن، بخیدن، فلخیدن، شیت‌کردن.

ع: حَلج، نَـدف، طَـرق، نَفش، حَـرن، نَـدش، مَـزع، نَسل، مَشع، ذَحي، تَشعيث، تَزبيد، تَـسبيخ، تَفديك، تنفيش، اجتِراد.

**کردنەوە**

ك: درووس‌کردن، سازکردن. [دروست‌کردن. بنیاتنان]

ف: ساختن، درست‌کردن.

ع: بِناء، اِحداث.

**کردوکار**

ك: کاروکردار، کاروبار. [ئیشوکار]

ف: کردوکار، کاروکردار، کاروبار.

ع: شُغل وَ عمل.

**کردوکێش**

[ك: بێلێکی پان و گەورەیە کە تەنافی پێـوە دەبەسـتن و زەوی کێڵراوی پێ تەخت دەکەن.]

ف: فه، بَنکَن، گَرّا، گراز، کراز.

ع: مِسواة، مِنسَقَة، مِسلَفَة، مِسفَلَة، مِجرَفه، جاروفَة.

وێنە

**کردەوە**

ك: کردار. [ئاکار]

ف: کردار.

ع: عَمَل، فِعل.

**کرژ**

ك: لوول. [گرژ: مووی لێك‌ئاڵاو. (بەرامبەری خاو.)]

ف: کرج. (ضد «خار»)

ع: جَعد، مُجَعَّد، مُحَظرَب، مُرَجَّل.

**کرژ**

ك: گورج، خەیرا، قۆچاخ. [چالاك]

ف: تُند، تیز، زرنگ، چابک، چالاک.

ع: جَلد، جَليد، هِفّ، فارِه، خَفيف، سَريع.

**کرژ**

ك: زوو، پەلە. [خێرا، بلەز]

ف: زود.

ع: سَريع، سَرِيعاً، فَوراً، مُعَجَّلاً.

**کرژکردن**

ك: لوول‌کردن. [گرژکردن]

ف: کرج‌کردن.

ع: تَرجيل.

**کرژکردن**

ك: زووکردن، پەلەکردن. [خێراکردن]

ف: زودکردن، شتاب‌کردن.

ع: تَسريع، تَعجيل.

**کرژەوکردن**

ك: تونکردن، گورجەوکردن. [چالاك کردن. گورجوگۆڵ‌کردن (وەك: کرژکردنەوەی گوێدرێژ.)]

ف: تُندکردن، چابک‌کردن، برافروختن. (الاغ مثلاً.)

ع: حَذق، اِسعار.

**کرک**

[(ك: زەوی رەق و تەخت.)]

ف: سفت هموار. (زمینی که سخت و سفت و هموار باشد.)

ع: سُهب، قِرق.

**کرك**

ك: رەپ، کووڕ. [ئیفلیج: ئەندامی گرژبووی لاروڵوێر.]

ف: کُنجُل، چنگولک.

ع: فَلَج، مُتشَنِّج، مُتَقَفِّع، مُتأزِّر، مُتَقَلِّص، مُلتَوِي.

**کڕکاکە**

ك: کڕاکە، کڕاك. [(کونی گوێ.)]

ف: سوراخ گوش.

ع: صِماخ، اُصموخ.

**کڕکەفتن**

ك: کڕ. [کڕکەوتن (لەسەر هێلکە نیشتنی مریشك بۆ جووجەڵە هەڵهێنان.)]

ف: کرافتادن. (نشستن مرغ بر تخم که جوجه شود.)

ع: حُبُوم، لُبُود، وُکُون، حُضُون، رَخَم، اِرخام، تَرخیم، تَجَفجُف، اِحتِضان.

**کرم**

ك: سنگ. [جانەوەری خزۆکی بچووك.]

ف: کرم، کوخ.

ع: دود. قَدح، قادِحَة. نَغَف، نَغِیف.

**کرماج**

ك: کرمانج. [بەشێکی هەرەزۆر لە کورد.]

ف: کرماج.

ع: کِرماج.

**کرمانن**

ك: کووژتن، خرمانن. [کرۆژتن (وەك: کرماندنی شەکر.)]

ف: کلوجیدن. (قند مثلاً.)

ع: حَرت، قَضم، خَضم، کشا، قثا، حَتَرشَة.

**کرم بەفر**

ك: زولاڵ. [شتێکی کرم‌ئاسایە لە ناو بەفردا، ئاوێکی ساردی تێدایە.]

ف: زلال، کرم برف.

ع: دُودُ الثَّلج.

**کرم دار**

ك: مۆریانە. [مۆرانە: جانەوەری دارخۆر.]

ف: گُهَن، موریانه، مورچانه، چوب‌خوراک.

ع: سوسَة، اَرضَة.

**کرمکار**

ك: بەڵەد، شارەزا. [ئاگادار، کارزان]

ف: بَلَد، کرم‌کار.

ع: بَصیر، مُطَّلِع، ماهِر، اِبنُ بُجدَة الأمر.

**کرمکە**

[(ك: ژێرچەنەیەکی زێڕینی ژنانەیە که دەنکەکانی لە کرم دەچێت.)]

ف: کرمَک. (زیر چانه‌ای است زنانه از طلا می‌سازند که دانه‌های آن شبیه به کرم است.)

ع: ....

**کرم گەنم**

[(ك: کرمێکە لە کێڵگەی دانەوێڵەدا پەیدا دەبێت.)]

ف: شنگرف، شنگزن. (کرمی است در غله‌زار تولید می‌شود.)

ع: شَنجَرف.

**کرم مەعدە**

ك: کرم ناوزك، کرم. [کرمی شریتی]

ف: کدودانە، کرم.

ع: حَبُّ القَرع، دُود.

**کرم مێوە**

ك: کرم. [کرمی ناو میوە.]

ف: کرم، کوخ.

ع: دُود.

**کرمۆژن←کرمۆڵ**

**کرمۆڵ**

ك: کرموژن. [کرماری، کرمیَ]

ف: کرمخوردە، کرمأوژَن.

ع: مَنخور، مُتَأَکِّل، مُتَآكِل، مَدود، مُدَوِّد، فاسِد.

**کرمە**

ك: خرمە. [دەنگی کرۆژتن (وەك: دەنگی کرۆژتنی قەند.)]

ف: کُلوچ. (صدای خوردن قند مثلاً.)

ع: قَضم، خَضم، حَرت، هَیقَم، حَتَرشَة.

**کرمەبەفرینە←کرم بەفر**

**کرمەك**

ك: کورەك، زوانە. [(زمانەی قفڵ.)]

ف: مدنگ، کرمَک، زبانە، زبانەی قفل.

ع: لِسان، لُسَیِّنَة، لِسان القُفل.

**کرم هەورێشم**

ك: هارپە. [کرمی ناوریشم.]

ف: کُناغ، دیوە، پیلە، کرم ابریشم.

ع: دُودُ القَزّ.

وێنە

**کرنگ**

ك: بـــیـهـــەنجیر. [گەرچــەك (تــورکیش «کەرچــەك»ی پیّدەڵێن.)]

ف: گُرچَک، بیدأنجیر، تَمرا. (ترک هم «کرچک» می‌گوید.)

ع: خِروَع، طَمراء.

**کرنگ**

ك: تۆم بێهەنجیر. [گەرچەك: مەبەست بەرەکەیەتی.]

ف: تخم بیدانجیر، گرچک.

ع: حَبُّ الخِروَع.

**کرۆتن**

ك: کرۆژتن، کرمانن، کرۆچانن. [کرۆشتن، کرماندن]

ف: جاییدن، گازگرفتن، کلوجیدن.

ع: قَضم، خَضم، حَرت، مَضغ، کَثأ، حَتَرشَة.

**کرۆچانن←کرۆتن**

**[illegible]**

ك: خرۆچك، کرۆچك، خرمۆچــك، خرموتــە، خــرۆچ خــرۆچ.

[کرکراگە، کرۆچمنە]

ف: کُرجَن، چَرَندو، جَرنده.

ع: غَضرُوف.

**کرۆر**

[(ك: سەدهەزار)]

ف: کرور. (صد هزار)

ع: کَرَ، کُرُور.

**کرۆژ**

ك: جاو. (شمــشێرکرۆژ) [پاشگرە، بــە مانــای کســێك کــە شتێك دەجاوێ.]

ف: کلوجندە، جایندە.

ع: قاضِم، خاضِم...

**کرۆژتن←کرۆتن**

**کرۆژین←کرۆژتن**

**کرۆکاش**

ك: کەراوکۆشا. [هەوڵ و تێکۆشان]

ف: کار و کوشش.

ع: سَعي و عَمَل.

**کرۆکاشکەر**

ك: کاری و کۆشا. [هەوڵدەر و تێکۆشەر]
ف: کارا و کوشا.
ع: ساعي وَ فَعّال.
**کرۆڵ**
ك: کلۆڵ، ڕۆژڕەش، سیاتاڵە. [بەدبەختە چارەڕەش]
ف: بَدبَخت، مَندَبور. بینوا. سیەروز.
ع: شَقِيّ، نَحس، مَنحوس. مَفلوك.
**کرووز**
ك: کلووز. [(پیری پەککەوتەوی کۆماره.)]
ف: کریزی. (پیر فرتوت خمیده)
ع: لاشَيء، فاني. فَقیر. عاجز.
**کرووزانن**
ك: کولـــووزانــن. [فەوتانــدن. هــەژار خــستن (تیــابردنی کسێك.)]
ف: نابودکردن. (کسی را از هستی ساقط کردن)
ع: اِفناء، اِفقار.
**کرووزەکرووز**
ك: کولووزەکولـووز، کرووزیانــەوە. [کرووزانــەوە (دەربــڕینی نەداری و هەژاری.)]
ف: کزکزکردن، کروزش. (اظهار نیستی و نداری کردن)
ع: تَفاقُر، تَعاجُز.
**کرووزیانەوە**
ك: کلووزیانـــــەوە. [کرووزانـــەوە (دەربـــڕینی نـــەداری و بێدەسەڵاتی.)]
ف: کــروزش، کزکــزکــردن. (اظهـــار نیـــستی و ناتوانی کردن)
ع: تَفاقُر، تَعاجُز.
**کرووس**
ك: کەڕ، نەژنەوا. [گوێ کپ]
ف: کر، کَلیاوه، شَوا، نَشنَوا، ناشنَوا.
ع: اُطروش، اَصَمّ، اَصلَخ.
**کرویت**
ك: گۆگرد، شغارتە. [شقارتە]
ف: گندش، گوگرد.
ع: شَحّاطَة، کِبریت.
**کرە**
ك: هاڕین. [کردن بە ئارد.]
ف: آسیاکردن.
ع: طَحن، کَرکَرَة.
**کرە**
ك: کرەکر. [(دەنگی ئاش.)]
ف: کرکر. (صدای آسیا)
ع: جَعجَعَة، کَرکَرَة.
**کرە**
[(ك: دەسارێ دارین، قیری پێدا دەساون و برنجی پێ پاك دەکەن.)]
ف: دستآس‌چوبی. (با قیر می‌اندایند و برنج را با آن پاک می‌کنند.)
ع: غَریبَة، جاروش.
**کرە**
[ك: دەنگێکە. (ئاسن کاتێك دەدات لە زەوی وشك.)]
ف: رسیدن گاوآهن به زمین خشک.
ع: ....
**کرەکر**
ك: کرە. [کرەی زۆر. (وەك دەنگی ئاش، دووبـارەبوونەوەکەی لەبەر زۆربوونیەتی.)]
ف: کرکر. (صدای آسیا مثلاً، تکرار برای تکثیـر

است.)

ع: جَعجَعَة، کَرکَرَة.

**کریّ**

ك: مز، مزە، کراهە. [حەقی کار، کرا، ئیجارە]

ف: مُزد.

ع: کِرایَة، جُعالَة، اُجرَة، اَجر.

**کریاری**

ك: کراهەدان. [بەکرێدان]

ف: کرایەداری، کرایەدادن.

ع: اِجارَة، اِکراء.

**کریانەوە**

ك: بەربوون. [کرانەوە (وەك: کرانەوەی تەناف یا پشتێن.)]

ف: بازشدن، واشدن. (رسن یا شال کمر مثلاً.)

ع: اِنتِقاض، اِنتِشار، تَنَشُّر.

**کریانەوە**

ك: وازبوون. [کرانەوە، ئاوەلا بوون.]

ف: بازشدن، گشودەشدن. (در مثلاً.)

ع: اِنفِتاح، اِنفِجاء، اِنبِلاق.

**کرێش**

[ك: کرێژ، قرێژ] (کرێش سەر مەسەلەن.)

ف: سَبوسە، حَزازە.

ع: اِبرِیَّة، هِبرِیَّة، تِبرِیَّة، سَکَبَة، حَزازَة، مُوارَة، نُباغَة، جُراشَة.

**کرێکار**

ك: کاریگەر. [کەسێك کە بە کرێ کار دەکات.]

ف: کارگر، مُزدور، مُزدبَر، مُزدکار.

ع: اَجیر، عَمَلَة، فَعَلَة.

**کرێڵ**

ك: سەخناخ. [قاقڕ، رەقەن (بەرانبەری نەرمان.)]

ف: سنگلاخ، شنزار. (ضد «نەرمان»)

ع: لُوب، حَرَّة.

**کڕین**

ك: خڕین، سەنْن. [سەندن بە پارە وەرگرتن. (وشەیەکی کرماجیە.)]

ف: خریدن. (کرماجی است.)

ع: اِشتِراء، اِبتِیاع.

**کڕیوە**

ك: تۆف، تۆفان، بادوە. [بادەوە، تۆف]

ف: دَمە، بادَمَە، کولاک، شورش.

ع: زَوبَعَة، عاصِفَة، طوف، دَمَق.

**کز**

ك: دامردگ. [ژاکاو]

ف: اَفسُردە، پَژمُردە؛ درهم‌رفتە، کُلَه‌خوردە.

ع: مُنقَبِض، مَلول، کَزّ.

**کز**

ك: کەم، سوك. [سووك لەخوارتر (بەرامبەری چەور.)]

ف: کَم، سَبُک. (ضد «چەور»)

ع: خَفیف. ناقِص، شِفٌّ، اَقَلّ.

**کزانن**

ك: تووزانن. پرووزانن. [تزاندنەوە. هەڵپرووزاندن]

ف: پایازی، سوزش. سوزاندن. خنجیراندن.

ع: حُرقَة، جَوی، اِحراق. لَفح، تَشویط، تَشییط، اِکراش.

**کزر**

ك: نیمەشك. [پنر، نیوەوشك]

ف: هفت، نیم‌خُشک.

ع: نَشیف.

**کزکوڵە**

ك: کزکە، کسکۆڵە، گورپ. [کزومات]

ف: کز، گُرنج. چُنباتمە.

ع: تَشَنُّج، تَقَبُّض، قَرفَصة، قَرفَطة، جَرمَزَة، اِکمِهلال، کَزّ.

**کزکۆڵەکردن**

ك: کسکۆڵەکردن، گورپکردن. [کز و مات دانیشتن]

ف: گُرنجیدن، کزکردن.

ع: اِقرِعباب، اِقرِنفاط، اِجرِمزاز، تَقَرفُص، کَزّ.

**کزکە**

ك: کسکە، کزکۆڵە، کسکۆڵە، گورپ. [کز و مات]

ف: کز، گُرنج، درهم‌رفتن.

ع: اَروز، تَقَبُّض، تَقَرفُط، تَجَرمُز، تَقَرفُص، اِقرِعباب، تَقَرعُب، کُزوزَة، کَزّ.

**کزن**

ك: توورِن. (توول کزن) [تۆزێنەرەوە (وەك: شووڵی تەڕ.)]

ف: سوزنده. (خامه‌ی تر مثلاً.)

ع: مُحرِق، سِخّین.

**کزن←کلێنە** [(وشەیەکی کرماجیە.)] (کرماجی است.)

**کزە**

ك: سەرما، سۆڵە. [بای سارد.]

ف: سرما، سردباد، باد سرد.

ع: حُرقَة، بُرودَة، بَلیلَة، سَنسَنَة.

**کزە**

ك: جزە، چوڵە. چزە. [دەنگی داخ کردن. (وەك: دەنگی برژانی کباب.)]

ف: کزه، سوزش. (صدای برشته شدن کباب مثلاً.)

ع: حُرُوق، نَصیص، نَشیش، قَشقَشَة.

**کزەبا**

ك: کزە، سەردەبا. [بای سارد.]

ف: سردباد، باد سرد.

ع: بَلیلَة.

**کزیان**

ك: توورزیان. [کزانەوە، تۆزانەوە]

ف: سوزش، سوختن.

ع: اِحتِراق.

**کزیانەوە**

ك: توورزیانەوە. کوڵووزیانەوە. [تۆزانەوە. کرووزانەوە]

ف: سوختن، سوزش‌کردن. کروزش.

ع: اِحتِراق. تَفاقُر.

**کزێنکە**

[(ك: هەویری زۆر شلی وەك «شلکێنە» دەرێژنە سەر ساج دەبێتە نان پاشان دەیخەنە ناو رۆنی قرچاو و دەیخۆن.)]

ف: خمیر خیلی شُل مانند «شلکێنه» روی ساج می‌ریزند نان می‌شود و آن را توی روغن داغ شده می‌گذارند و می‌خورند.

ع: ...

**کژك**

[(ك: تەنگی ولاخ کە لە خوری یا دەزوو دروست دەکرێت.)]

ف: نوار تنگ. (تنگ الاغ که از پشم یا نخ می‌بافند.)

ع: وَضین.

**کس!**

ك: یخ!، گس!. [(وشەی دەنگدانی مەڕ.)]

ف: کس! (کلمه‌ی راندن گوسفند است.)

ع: شُؤ!، شَا!، فَع!، هَر!. (شَاشَأة، فعفعَة، هَرهَرَة-شُؤشُؤ!، شَاشَا!، فَعفَع!، هَرهَر!)

**کسکۆڵە←کزکۆڵە**

**کسکە←کزکە**

**کسکیانەوە**

ك: کزکیانەوە، کزیانەوە، نسکیانەوە. [کزومات بوون]

ف: درهم‌رفتن، انـدوهـناک‌شـدن، دلتنـگ‌شـدن، نُستیدن.

ع: تَضَجُّر، تَبَرُّم، تَلَهُّف، تَمَاُّق.

**کسم**

ك: کار، پێشە. [پیشه کاسبی، نیش]

ف: پیشه، کار، اَلفَخت، اَلفَغد، اَلفَنج. اَلفَختن.

ع: کَسب، عَمَل، صَنعَة، حِرفَة، رَقاحَة.

**کش!**

ك: کـشه! [(وشـەیەکی دەرکردنـی مریـشکە، واتـە: دوور بە!)]

ف: کش!، کیش! (کلمـه‌ی رانـدن مـرغ اسـت بـه معنی: دورشو!)

ع: کِش!

**کش!**

ك: شا! [(وشەی دەرکردنی پاشایە لە یاری شەترەنجدا.)]

ف: کش!، کیش!، کشت!، شاه! (کلمه‌ی راندن شاه است در بازی شطرنج.)

ع: کِش!، شاه!

**کش←هەڵپەڕین**

**کشت**

ك: کاشتە، وەرز. (کشتوکاڵ) [چاندن کشتوکار]

ف: کِشت، بَرز، وَرز، وَرزه.

ع: زَرع، زَراعَة.

**کشتوکاڵ**

ك: کشت. [چاندن کشتوکار]

ف: کشت‌وکار، کشاورزی.

ع: زَراعَة، زَرع.

**کشتەڵە**

ك: دەزگ. [(دەزووی پێکەوە بادراو.)]

ف: نخ، درزمان. (نخ تاب داده شده)

ع: فَتیل.

**کشکش**

ك: هەڵپەڕین، کشکردن. [جۆرە سەمایەکە.]

ف: پَنزیدن، پنجیدن، بَرجَستن، وَشتیدن.

ع: رَقص، تَرَقُّص، تَنَفُّز.

**کشکش!**

[ك: بەحیمەحا: وشەی دنەدانە.] (کشکش و نینای نەکرد.)

ف: کَش‌کَش!، خوش‌خوش!

ع: بَخٍ بَخٍ!

**کشکشان←کش‌کش کردن**

**کشمیش**

[ك: ترێی بێ‌دەنکی وشکەوەکراو.]

ف: کشمش.

ع: عُنجُد، کشمش، قشمش.

**کشنیژە←گژنیژە**

**کشە**

ك: خـشە. [(دەنگـی تێپـەڕینی مـار یـا زەرعاتێـك کـە بـا لێی‌دەدات.)]

ف: کشه. (صدای گذشتن مار یا زراعت کـه بـاد به آن بخورد.)

ع: کَشیش، کَشکَشَة.

**کشە!**

ك: کش! [(وشەی دەرکردنی مریشکە.)]

ف: کش!، کیش!، کشه!، کیـشه! (کلمـه‌ی رانـدن مرغ است.)

ع: کِش!. کَرکَرَة.

**کشێ**

[(ك: سورکەڵناوی «کیشوەر»، ناوە بۆ ژنان.)]

ف: مخفف «کشور» اسم زن است.

**کفت**

ك: خوەرە. [نەخۆشی خۆرە]

ف: کوفت، خوره.

ع: اکِلَة.

**کفت**

ك: نشسس. خۆرد. نیشتنەوە، نیشتاو. (چوگەسە کفت.) [هاتنەوەیەك. کشانەوەی ئاو.]

ف: نشست. آب‌نشین.

ع: قَبض، تَقَبُّض. جَزر.

**کفت**

[ك: پاشگرێکە مانای تێهەڵساوراو دەداتە وەك: زێرکفت.] (تەلاکفت)

ف: کوب. (طلاکوب)

ع: دَمج، تَنبیت. (مُطَلّا، مُنَبَّت)

**کفت**

ك: لـمت، ماسە. [لـم]

ف: خَرّه، ماسه.

ع: مَیح، خُلب، حَمأَة. مَلغَمَه.

**کفتوکو**

ك: گژوبژ، قرچوبەم. [سفت و شل (هاتنەوەیەك و کشان.)]

ف: نشست و برآمد، پَخس و بَم. (سفت شدن و شل شدن)

ع: قَبض وَ بَسط. جَزر وَ مَدّ.

**کفته**

[ك: خواردنێکە بە قیمە و لەتکە و برنج دروست دەکرێت.]

ف: کوفته، کوبیده، خوزی.

ع: مُدَقّقة. خَذیعَة. کُبَّة، کُفتَه.

**کفته شۆروا**

[ك: کفتە شۆربا: چێشتێکە.]

ف: کوفته شوربا.

ع: طَبیخُ المُدَقّقة.

**کفته ناوتاوەیی**

ك: کفتە تاوەیی. [کفتەی سوورەوەکراو.]

ف: خوزی، کوفته‌ی سرخ‌کرده، کوفته تابه‌یی، کوفته بریان.

ع: خَذیعَة.

**کففه**

ك: قژژە، کەف‌کردن. [فیچقە کردن. دەنگی فیچقە کردن. (وەك: دەنگی دەربەرینی خوێن لە قورگی ئاژەڵی سەربڕاوەوە.)]

ف: جَهش، جَستن. کف‌کردن. (صدای جستن خون از گلوی مذبوح مثلاً.)

ع: نَهر، بَغ، ثُغور، تَبَوُّغ. تَحَمُّض، تَزَبُّد.

**کل**

ك: کلا، کەچ، لا، کەنار. [خوار. قەراخ]

ف: کج، کنار.

ع: نَحو، ناحِیَة، جانِب، مُنحَرِف، طَرَف.

**کلا←کل**

‹**کلاس**›

ك: پۆل، پلە، پایە. [ئاستە ریز، پلەی زانست]

ف: پلّه، پایه، دانش‌پایه.

ع: طَبَقَة، مَرتَبَة، رُتبَة.

‹**کلاسمان**›

ك: قەفەزە. [دۆلابی قاتقات.]

ف: أشکوب، آشکوب، قَفسه.

ع: طَبَقات، مَراتِب، مَحفَظَة، قَفَصَة.

**کلك**

ك: ئەنگوس. [پەنجە]

ف: کلک، کلیک، انگشت.

ع: اِصبَع، بَنان.

وێنە←ساقۆڵ

**کلك**

ك: قەڵەم. [خامە پێنووس]

ف: خامه، قلم، کلک، نال.

ع: یَراعَة، مِرقَم، قَلَم... .

**کلکبەس**

ك: ... کلکبەسە، ئەنگوسبەسە. [بەنێکە دەبەسرێت بە پەنجەوە بۆ لەبیرنەچوونەوەی شتێك. هەروەها: پەنجەبەسراو بە بەن.]

ف: انگشتبند. انگشتبسته.

ع: رَتمَة، رَتیمَة. رَتِیم.

**کلك بەستن**

ك: ئەنگوس بەستن. [بەن بەستن بە پەنجەوە (بۆ ئەوەی مەسەلەیەك لەبیرنەچێتەوە.)]

ف: انگشتبستن. (برای اینکه مطلب فراموش نشود.)

ع: رَتم، اِرتام، اِستِذکار.

**کلکبەسە**

ك: ئەنگوسبەسە. [پەنجەبەسراو بە بەن.]

ف: انگشتبسته.

ع: رَتِیم.

**کلك پیەوکردن**

ك: کلکەقنگێ. [پەنجە بۆ بردن. (ئیدیۆمیشە لە دنەدان) بۆ تووڕەکردن.]

ف: اَنگُلَک کردن. (کنایه از تحریک هم هست.)

ع: شَکز، نَدغ. تَحریك، تَحریش، اِغراء.

**کلکردن**

ك: لادان، کەنارگرتن. [لەرێلادان، کلابوون]

ف: کنارگرفتن.

ع: عُدُول، تَحَرُّف، اِنحِراف، تَجانُب، تَنَحّي.

**کلکگیر**

ك: دووهەلگیر. [کلك بەرزکەرەوە. (وەك: ئەسپی کلکگیر.)]

ف: دُمگیر. (اسپ مثلاً.)

ع: ساطي، مُستَطِلّ.

**کلکنشان**

ك: نشانکرد. [دەسنیشان، دیاریکردن]

ف: انگشتنشان.

ع: صَبع، اشارَة.

**کلکە تووتەڵە**

ك: تووتە، تووتەڵە. [قامکە بچکۆلە، پەنجەی تووتە]

ف: کلک، کلیک، کابلج.

ع: خِنصَر.

وێنە← ساقۆڵ (٥)

**کلکەقنگێ**

[ك: پەنجە بۆ بردن. دنەدان بۆ تووڕەکردن. (ئیدیۆمە.)]

ف: اَنگُلَک. (کنایه است.)

ع: تَحریك، تَحریش، اِغراء، شَکز، نَدغ، نَخس.

**کلکەکەڵە← کلکەگەورە**

**کلکە گەورە**

ك: کلکەکەڵە. [پەنجەی ئەسپێ‌کوژە.]

ف: انگشت نر، شَست.

ع: اِبهام.

وێنە← ساقۆڵ (١)

**کلکەنما**

ك: ئەنگوسنما. [ناسراو، بەناوبانگ، عیبرەتە پەن (لە خراپیدا.)]

ف: انگشتنما. (به بدی)

ع: شُهرَة. عِبرَة، نَکال. شَهیر، مُتَعَیِّن.

**کلکەنما**

ك: ئەنگوسنما. [بەناوبانگ، ناسراو، دیاریکراو]

ف: انگشتنما.

ع: مُعَیَّن، مُشَخَّص، مُخَصَّص.

**کلکەوانە**

ك: ئەنگوسیلە. [ئەنگوستەویلە]

ف: اَنگُشتَر، اَنگُشتَری.

ع: خاتَم، خاتِم، خاتام، خَتَم.

وێنە← ئەنگوستیلە

**کلکەوانە**

[ك: شتێکی کلاوئاسایە پەنجە لە دەرزی دەپارێزێت (لە دروومانداد.)]

ف: انگشتانه. (خیاطی)

ع: قِمع، قِمَع، کُشتُبان.

وێنە

**کلیسا**

ك: کەنیشتە. [پەرستگای مسیحیەکان.]

ف: کلیسا، کلیسه، کَنشت.

ع: بیعَة، کَنیسَة، کَنِشت.

**کلیلی بەهەشت← کەلیمەی شادەت**

**کل**

ك: هەوەر. [جێگەی سوالەت سوورکردنەوە.]

ف: آوَندان.

ع: فاخورَة. مُحَمَّة، مَشوی، اَتّون.

**کل**

ك: کلە. [کلە کل، سورمە]

ف: سُرمه.

ع: کُحل.

**کلاش**

ك: چەمچم. [پێڵاوی بنپەڕۆ یا بنچەرم.]

ف: کلاش. گیوه، چُمچُم.

ع: حِذاء.

**کلاشە**

[(ك: لکانی قوڕ بە کلاشدا کاتێك کە زەوی لە سەرەوە بووە بە قوڕ و لە بنەوە وشکە.)]

ف: به گیوه چسپیدن گل که روی زمین گل شده و زیرش خشک است.

ع: ...

**کلاشین**

ك: خۆراندن. [خوراندن]

ف: خاراندن. خراشیدن.

ع: حَكّ.

**کلاف**

ك: کلافە. [لە یەکتر پێچانی دەزوو بە شێوەی درێژکە.]

ف: کَلاف، کَلافه، کَلابه، کَلاوه، چِلَک، چغرسته، چغرشته، چفرسته.

ع: کُبَّة. لَفیفَة.

وێنە

**کلافە**

ك: خوێگل، پارەهەڵکەر، کلافەهەڵکەر. [کلافەگر، پارکەر]

ف: چَهره، چَرخه، کلابه، کلافه.

ع: حَلّالَة، دُولابُ المِغزَل.

وێنە← پارەهەڵکەر

**کلافە**

[(ك: پەتێکە دەیبەستن بە پێی ئەسپ یا ئێسترەوە بۆ خۆشڕەوت بوون.)]

ف: چدار. (ریسمانی که به پای اسپ یا استر بندند تا یُرغه شود.)

ع: ...

**کلافە**

ك: چوارچێوە. [(چوارچێوەی قادرمە یا پەیژە.)]

ف: چارچوبه. (چهارچوبه‌ی پایه یا پله)

ع: حِتار، کِفاف، بِروار.

**کلافە← کلاف**

**کلافەهەڵکەر**

ك: خوێگل، پارەهەڵکەر، کلافە. [کلافەگر، پارکەر]

ف: جهره، چَرخه، کلابه، کلافه.

ع: حَلّالَة، دولاب المِغزَل.

وێنە← پارەهەڵکەر

**کلانە**

[ك: جۆرە مووروویەکە بۆ چاوەزار بەکاردێت.]

ف: جَش، خَرمَک، خورتک.

ع: زَرقَة، تمیمَة، غَضارَة، غَضار.

**کلانەوکووژەکە**

[ك: دوو جۆر موورووە بۆ چاوەزار بەکاردێت.]

ف: خَرمَک، خَرتَک، خَرمُهره.

ع: سُلوانَة، تَمیمة، سُمَّة.

**کلاوبۆرکە**

ك: پاڵوانە. [پاڵوێنە: ئەو کیسەیەی کە شلەمەنی پێ دەپاڵێون.]

ف: پالا، پالوانه، پالاوان.

ع: غَلَل، مِبزَل، مِصفاة.

وێنە← تورشیساف‌کەر

**کلاو بۆرکە**

[ك: جۆرە کلاوێکە.]

ف: گَلوته، کلوته.

ع: قُبَّعَة، مِمطَر، طُرطُور. (اِسکیم)

وێنە← دووقۆچکە

**کلاو سەخری جن**

[ك: دەمامك]

ف: روپوشه، روی ساختگی، ماسک، ماسکه،

ع: مَسخَرَة، اَلوَجهُ الاِستِعاري.

**کلاوفەرەنگی**

ك: کۆشك. [قسر، خانووبەرەی گەورە و جوان.]

ف: کاخ، کوشک، کلاه فرنگی.

ع: صَرح، بَیتُ التَفَرُّج، جَوسَق.

وێنە← کۆشك

**کلاوقۆچکە**

[ك: جۆرە کلاوێکە کە هەردوو گوێش دادەپۆشێت.]

ف: کلوته، گلوته، دوگوشی، کلاه دوگوشی.

ع: قُنبَعَة، قُبَّعَة، قُبُوعَة.

وێنە← دووقۆچکە

**کلاونە**

ك: ... کاکۆڵ، پۆپە، کلاوە. [کلاوە، پۆپنە]

ف: خُرج، خُوجه، جوج، پوب، پوپ، کاکُل.

ع: قُنبُرَة، مِغفَر، تاج.

وێنە← جووڕە

**کلاوە**

ك: چیە، قەلەپۆپە، پۆپە. [ترۆپك لوتكە]

ف: کَلّه، چکاده.

ع: ذِروَة، قُلّة.

**کلاوە**

ك: کاسە. [شتێکی کلاوئاسایە کە بەڕووی لەخۆگرتووە.]

ف: کاسه.

ع: قِمع، قَمع، قِمَع.

وێنە

**کلاوە← کلاونە**

**کلاوەی بەیاخ**

[ك: بەشی سەرەوەی ئاڵا.]

ف: اَژدَر.

ع: قُبَّةُ اللِّواء.

وێنەی هەیە.

**کلاوەی زرانی**

ك: کاسەی زرانی، کەشکەزرانی. [کشکە ئەژنۆ]

ف: گُردنا، کاسه‌ی زانو، استخوان سر زانو.

ع: رَضفَة، ثُفّاحَة، داغِصَة.

**کلپە**

ك: بلێسە، گرپە. [(دەنگی هەڵگرسانی ئاگر.)]

ف: کُخته، گُرُپ. (صدای برافروختن آتش)

ع: لَهیب، کَلحَبَة، اِشتِعال.

**کلدان**

ك: کلدان. [کلتوور: جێگەی کلە.]

ف: سُرمەدان.

ع: مُکحُلَة.

وێنە ← کلەدان

**کلفت**

ك: قەڵەو، قـوڵ، قـەوی، زەلام، زل، تێـسمێرپاگ. قلەتـدار، مەغزدار، درشت، چاخ، گۆشتن. [تۆکمە نستوور، زەبەلاح]

ف: کُلُفت، سـتَبر، اسـتَبر، سـطَبر، زَفـت، گُنـده، دُرُشت، چاغ، فربه، اشگَرف، دَوسَری، دَوسَرانی، پُشتدار.

ع: ضَخیم. لَحیم. جاسِئ، قُنبُل، غَلیظ، ثَخین... .

**کلفتی**

ك: رەوق، قلەت، توڵی، قەڵـەوی، زلـی، زەلامـی. چـاخی، درشـتی. گۆشـتنی، تێـسمێرپاگی. مـەغز. [نسـتووری، تۆکمەیی]

ف: کُلُفتی، ستَبری، استَبری، درشـتی، گُنـدَگی، زَفتی، فربهی، اشگرفی، چاغی، ستَبرنای.

ع: ضَخمَة، ضَخامَة، غِلظَة، جُسُوء، ثِخَن، ثُخانَة.

**کلفەت**

ك: خێزان. [ژنومنداڵ]

ف: خاندان، خانواده، زنوبچه.

ع: عائِلَة، اُسرَة، حُزانَة، کُلفَة، عِیال.

**کلکاف**

[ك: کلکاف: بەرێکی دارمازووە.]

ف: کلکاف.

ع: عَفص، قَلقاف.

وێنە

**کلە**

ك: کلٚ. [کل، کلە، سورمە]

ف: سُرمه، توتیا.

ع: کُحل، اِثمِد، لَمك، لَماك، جِلاء، توتیا، اَنتیموان

**کلەدان**

[ك: کلدان، کلاّن]

ف: سُرمەدان.

ع: مُکحُلَة.

وێنە

**کلیشە**

ك: بن‌کلیشە، بن‌بەخەڵ، بنەگل. [بن‌هەنگڵ]

ف: کَش، بَغَل.

ع: اِبط.

**کلێلٚ**

[ك: کلیل]

ف: کلید، برنگ، بَرَنگ، بَژَنگ.

ع: مِفتاح، مِفتَح، کلید، اکلید، قلید، اقلید، مقلاد.

**کلێلٚ بەهەشت** ← **کەلیمەی شادەت**

**کلێلٚ دەروازە**

[ك: کلیلی دەروازە.]

ف: کُـده، کَـژه، کَـژَک، کَژوَنـد، کَلیچـه، مَـدَنگ، بشکَل، بشکَله، بَشکَنه.

ع: قُناحَة، مِغلاق، مِفتاح.

وێنە ← دیانەی کلێلٚ (۲)

**کلێلٚ و دوینە**

[ك: چیرۆك، کەلیلە و دیمنە[1]]

ف: کلیل و دَمنه، اَفسانه.

ع: حِکایَة.

**کلێلٚ و کولۆم**

[(ك: قفلٚ و کلیلی دەروازە.)]

ف: کُده، فَلج، فَلجَم، کَلانـی، کلیـدان، اَسـکَندان. (مَدَنگ و اَسکَندان)

---

۱- کەلیلە و دیمنە: ناوی کتێبێکی چیرۆکی کۆنە. (ر ـ ر)

**کلێلە**

[ك: رنوو (کلیلەی بەفر کە با بەدی‌دەهێنێت.)]

ف: کلیله، کَل فَخشنگ، بهمن. (کلیله‌ی برف کـه باد آن را تشکیل می‌دهد.)

ع: کُداس.

**کلێلەبوون**

ك: ژنیان. [رەق‌بوونی دەم (قولفبوونی دەم و دان بە جۆرێك کە نەکرێت بیکەیتەوە.)]

ف: بَشلیدن، پَشلیدن. (به هم چسپیدن دندان‌ها که نتوان باز کرد.)

ع: ...

**کنا**

ك: ژن، کـــەنی. [ئــافرەت («کناچـــە» بـــچووککراوەی «کنا»یە.)]

ف: زن. («کناچه» تصغیر «کنا» است.)

ع: مرأة.

**کنا!**

ك: ژنەکە!، کنێ! [ئافرەت! (شێوازی بانگ‌کردنە.)]

ف: زنَکه! (خطاب است.)

ع: اَمرَأَةُ!

**کناچە**

ك: کەنیلـــە، کەنیـــشك، کـــچ، دۆت، دوێـــت. [کیـــژ (بچووککراوەی «کنا»یە.)]

ف: دُغد، دُخت، دُختر. (مُصغَّر «کنا» است.)

ع: بِنت، اِبنَة.

**کنار←سەدر**

**کنج**

ك: کـــاڵ، کـــەوگ، نەگـــەیگ. (کـــاڵوکنج. کنجوکـــەوگ) [نەگەییو، نەبەکام]

ف: نارَس، نَرَسیده، کبود.

ع: فجّ.

**کنجوکۆڵ←کنج**

**کنر**

ك: تەختە رێسمانی. [بەکرە، مەکارە]

ف: تخته ریسمانی.

ع: وَشِیعَة.

وێنە

**کنوکو**

ك: پلوپیا. [هەوڵ و تێکۆشان.]

ف: تَلاش، کوشش.

ع: سَعي، جَهد.

**کنیواڵ**

[(ك: گیایەکی تام و بۆن تیژە، لە کەوەر دەچێت، رەگەکـەی سەلکدارە، بە کاڵی و کوڵاوی بە نانەوە دەیخۆن.)]

ف: رافه. (علفی است تند طعم و تند بـو شـبیه به گندنا، بیخ آن پیاز است، خام یا پخته با نـان می‌خورند.)

ع: قِرط، کُرّاثُ البَغل.

**کۆ**

ك: کۆگا، گلێر، کۆمەڵە، جەڵە، جەم. [کۆما]

ف: کود، گرد، توده.

ع: کُومَة، جَمع.

**کۆ**

[ك: پێرو: کۆمەڵە ئەستێرەیەکە.]

ف: پَرو، پَروه، پَروین، پَرَن، پَرَند، رَفه، رَمه.

ع: ثُرَیّا.

**کۆ**

ك: گەڕەك. [تاخ، مەحەللە]

ف: کو، کوی، سو، اَسو، جَن، بَرزَن، تنیزه.

ع: مَحَلّ، مَحَلّة، کُور، کورَة. طَرَف، جانِب.

**کۆ**

ك: کەژ، کاو، کێف. [کێو، چیا]

ف: کوه.

ع: جَبَل، طَود.

**کۆ**

ك: سڵەمە، سڵەمیانەوە، ترسیان. [سڵ کردن، ترسان]

ف: رَم، تَرس.

ع: جُفُول، خَوف، واهِمَة.

**کوا**

[ك: کەوا]

ف: قَبا، یَلمَه.

ع: کِمع، دِثار، قَباء، یَلمَق.

**کوا**[2]

ك: کوانێ؟، ها لە کوێ؟ [لەکوێیە؟، لە کام جێیە؟]

ف: کو؟، کجااست؟

ع: أین؟

**کواچەرمەنگ**

ك: کواچەرمەنگ بەر تیپ. [کەوچکی هەموو کاسەیەك، خۆهەڵقورتێنەرە هەموو کارێك.]

ف: سفید قبای لشکر. نخود همه آش.

ع: نَصّاب.

**کوارك**

ك: دومەلان. [جۆرە قارچکێکە.]

ف: دُنبَلان، سَماروگ، سَماروخ، سَماروغ، خایەوَیس.

ع: کَما، کَمأة، نَجاة، سَمارُوغ، شَحمُ الأرض.

وێنە← دومەلان

**کوانگ**

ك: قوولکە، ئوجاخ، وجاخ، کوانوو. [ئاگردان]

ف: اجاق، آلاوه، آتشدان، کانون.

ع: جَوب، عُنَّة، بُؤرَة، أطِیمَة، مَوقِد، کانون.

**کوانوو← کوانگ**

**کوانێ**؟

ك: کوا؟ [لە کوێیە؟]

ف: کو؟، کجاست؟

ع: أین؟

**کۆبوون**

ك: خڕبوون، گردەوبوون، گلێرەوبوون، جەلَسەبوون، کۆمەڵەبوون، جەمبوون. [کۆبوونەوە، خڕبوونەوە]

ف: کودشدن، گردشدن، توده‌شدن، انبوه‌شدن.

ع: تَکَوُّم، اِجتِماع.

**کۆپار← کۆپارە**

**کۆپارە**

ك: کۆپار، گۆپار، گۆپارە[1]. [بەرزایی سەر پشتی وشتر.]

ف: کوهان، کوهه.

ع: سَنام، کِدنَة، هَودَة.

وێنە

**کۆپان**

[ك: کورتان.]

ف: پالان.

ع: رَحل، اِکاف، وِکاف، رَبیخ. قَتَب.

**کۆپاندوور**

ك: کۆپاندۆز. [کورتاندورر]

ف: پالان‌دوز.

ع: اَکّاف.

**کۆپان قەجەری**

ك: قەجەری، مەعرەکە. [جۆرە کورتانێکە.]

ف: پالان قجری.

ع: بَردَعَة، رحالَه، قَرّ، بَرذَعَة.

**کۆپەڕ**

[ك: پووشپەڕ (جەنگەی وشکبوونی گیای کێو.)]

---

۱- دوورکۆپارە: ف: بُختی ـ ع: یَعلول.

ف: کوەپَر. (موسم خشکیدن علف کوه)

ع: الماع، هیاج، هَیَجان.

**کوت**

ك: لەت، تیکە. [پارچە کوتە بەش]

ف: تیکە، پارە، لَخت.

ع: قِطعَة، کِسفَة، کِسرَة، فِلقَة، هَتَامَة.

**کوت**

ك: بڕ، پاژ. [بەش، کەرت (بەرامبەری گشت.)]

ف: لخت، پازتاری. (ضد کلّی)

ع: جُزء، جُزئِي.

**کوت**

ك: ناتەواو. [کەل، بەرامبەری تەواو.]

ف: اَهمە، اَنگارە، ناتمام.

ع: ناقص، غَیرُ کامِل.

**کوت**

ك: سوك. [ژنین لە کاتی جووتبووندا.]

ف: کُلَه.

ع: هَكّ، سَحق.

**کۆت**

[ك: چاکەت (چاکەت و پانتۆڵ)]

ف: کت. (کت و شلوار)

ع: ...

**کۆت**

ك: خـەلیلی. [پێـوەن (کۆتەرەیـەك کـە قاچـی تاوانبـاری تێدەکەن و دەیبەستن.)]

ف: کُند، کُندە، کَلَندر، کَلیدان. (کندەای کـە پـای مقصر را در آن کنند.)

ع: قِمطَر، مِقطَرَة.

وێنە ← خەلیلی

**کۆتا**

ك: کورت، کوتر. [کوڵ]

ف: کوتاه.

ع: قَـصیر، قاصِـر، کـوتِيّ، کُنتـال. وَجیـز، مُـوجَز، مُجمَل، مُختَصَر، هَبتَر.

**کۆتا**

ك: بالآبوچك. [بالآکورت]

ف: کوتاه، کوتاەبالا.

ع: بُرکُع، قَصیر القامَة.

**کۆتاکردن**

ك: کۆتاوەکردن. [کوڵکردنەوە، کورتکردنەوە]

ف: کوتاەکردن.

ع: قَــصر، تَقــصیر، وَدن، تَــودِن، وَجــز، اِیجــاز. اِختِصار، اِجمال.

**کۆتان**

ك: شەوگا، هەسارگەلە. [(زنجی مەڕ و گا.)]

ف: خَباک، خَپـاک، کَمـرا، دیـل، شَـبگاه، شَـبغا، شَبغاد، شَبغار، شَبغارە، شَبغاز، شَـبغازە، شَـوگا، شَوگاه، شَوغا، شَوغاه، شَوغار، شَوغارە، غوشا، غوشاد، غوشای، غوشاک. (محوطـەی گـاوان و گوسفندان)

ع: حَریسَة، حَظیرَة، عُنَّة، کَنیف، اَرِیَّة.

**کوتانْن**

ك: وردکردن. [لەتوپەت کردن، هاڕین]

ف: کوفتن، کوبیدن، ساییدن، خوردکردن.

ع: دَقّ، دَكّ، دَهـك، هَـكّ، هَـرس، کَـسّ، رَضّ، قَـضّ. وَطا، دَوس.

**کوتانْن**

ك: لێدان. [کوتاندن پیاکێشان]

ف: زدن، کــوفتن، کوبیــدن، کُــستن، کوســتن، کویستن.

ع: ضَرب، وَجن، اَجن، دَقّ، لَطس. قَرع.

**کوتانْن بە زەوینا**

